دکتۆر
کەمال سەعدی

# ئازادیی ڕۆژنامەگەری و ئەخلاقی پیشە

دەزگای O.P.L.C بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
پرۆژەی ماف بۆ بەرهەمە یاساییەکان
ژمارە ( ٩ )

هەولێر ٢٠٠٤

دەزگای O.P.L.C بۆ چاپ و بڵاوکرنەوە
پرۆژەی ماف بۆ بەرهەمە یاساییەکان
ژمارە ( ٩ )

ناوی کتێب : ئازادیی ڕۆژنامەگەری و ئەخلاقی پیشە
دانانی : دکتۆر کەمال سەعدی مستەفا
چاپی یەکەم : ٢٠٠٤
پیتچنین و کاری کۆمپیوتەری : دانەر خۆی
تیراژ : ٥٠٠ دانە
چاپ : چاپخانەی منارە / هەولێر

## پێشەکی :

هەموو پیشە ( مهنة ) یەك بەپێی هەندێك پێوەری ئەخلاقی ڕێك دەخسترێ و ئەم ڕێکخستنەش بەشێك نییە لە ڕێکخستنی یاسایی بەلاّم سەرەڕای ئەمەش سیفەتی سەپاوە ( الزام ) ی هەیە بۆ ئەوکەسانەی لەم پیشەیەدا کاردەکەن و ڕوویەڕووی سزایەکی سەندیکایی دەبنەوە کە سەندیکایەکانیان ئاراستەیان دەکات . قورسیو سوکی ئەو سزایانەش بەپێی گەورەییو بچووکی ئەو سەرپێچیانە دەگۆڕێ کە ئەندامی ئەو سەندیکایە لە کاتی ئەنجامدانی کارە ڕۆژنامەوانییەکانی دەیانکات .

پیشەی ڕۆژنامەگەری وەکو هەر پیشەیەکیتر ، بەستراوە بە کۆمەڵێك بنچینەی ڕەوشت کە ڕۆژنامەنووسان و خاوەن ڕۆژنامەکان خۆیان لە ڕێگای سەندیکاکانیانەوە بۆخۆیانیان داناوەو دەبێ پابەندی بن. جا هەروەکو لەسەرەوە وتمان ، ئەم ڕێکخستنە پیشەییە هەرچەندە بەشێك نییە لە ڕێکخستنی یاسایی ، بەلاّم دەتوانین بڵێین تەواوکەری ئەوەو تەنانەت لە وڵاتە دیموکراسیخوازەکاندا ڕێکخستنێکی سەرەکییە.

لە سیستمی دیموکراسیدا ئەوپەڕی ئازادیو سەربەخۆیی دەدرێ بە ڕۆژنامەگەری چونکە ڕۆژنامەو کەناڵەکانی تری ڕاگەیاندن زمانحاڵی گەلن و لە ڕێگای ئەو کەناڵانەوە گەل گوزارشت لە بیروڕای خۆی دەکات . بۆیە بەشێوەیەکی سەرەکی ئەرکی ڕێکخستنی ئەو پیشەیە بۆ ئەندامان و کارمەندانی ئەو پیشەیە تەرك دەکرێ تەنها چەند لایەنێکی کەمی نەبێت کە لەڕێگتی یاساوە ڕێك دەخسترێ بەلاّم فراوانترین گرێنتی یاسایی بۆ دەستەبەر دەکرێ تاوەکو لە دەست تێوەردان و دەست درێژی حکومەت بپارێزرێت .

ئەمەو لە ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەو گرینتیانە گەیشتۆتە ئەو پەڕەکەی و تەنانەت دەستوری ئەمەریکی سالی ۱۷۹۸ لە یەکەمین هەمواری سالی ۱۷۹۱ دا ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە دەست تێوەردان و دەست درێژی کۆنگرێس زامن کردووەو تیایدا هاتووە :((**کۆنگرێس بۆی نییە هیچ یاسایەك دەربكات ئازادیی ڕۆژنامەگەری سنوردار**)) .

جا لەبەرئەوەی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە شێوەیەکی سەرەکی ملکەچی بەلگەنامەی شەرەفی پیشەو ئەو بنچینە ڕەوشتیانەیە کە ئەنجومەنی بالای ڕۆژنامەگەری و خودی دەزگاکانی ڕۆژنامەگەری دەریان دەکەن ، بۆیە لەخوارەوەو لەبەر ڕۆشنایی دەستوری ئەمەریکیو یاسای چاپەمەنیی لوبنانیدا لە سێ خالدا لەم بابەتە ئەتوژینەوە.

خالی یەکەم تەرخان دەکەین بۆ دیراسەکردنی دەستوری ئەمەریکیو ئازادیی ڕۆژنامەگەری . لە خالی دووەمدا باسی ئەنجومەنی بالای ڕۆژنامەگەری دەکەین و ئەنجومەنی بالای ڕۆژنامەگەری لوبنانی بە نموونە دەهێنینەوە . خالی سێهەمیش تەرخان دەکەین بۆ تۆمارکردنی بەلگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەگەریی کورستانی و نێودەولەتی . دواتر بە تۆمارکردنی ئەنجامەکان کۆتایی بە توژینەوەکە دەهێنین .

## ۱ دەستوری ئەمەریکی و ئازادیی ڕۆژنامەگەری

بەرلەوەی باسی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە دەستوری ئەمەریکی بکەین چەند پرسیارێك لە خۆمان دەکەین و دەپرسین

ئایا ئازادیی ڕەها هەیە تاکو ئازادیی ڕۆژنامەگەری هەبێت ؟ ئەگەر هەیە ، دەبێ ئەم ئازادییە لەکوێ بێت و ڕوخسارەکانی چیبن ؟

ئەی ڕاستە لە ئەمەریکا ڕۆژنامە ئازادەو دەستور کەفالەتی دەکات و کۆنگرێسیش بۆی نییە یاسایەك دەربکات بۆ دیارکردنی سنوری ئەم ئازادییە ؟ ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ڕۆژنامەگەری لەو وڵاتە دەسەڵاتە ؟ ئەبێ شوێنی ئەو دەسەڵاتە لەنێو سێ دەسەڵاتە گشتییە تەقلیدییەکان یاسادانان ، جێبەجێکردن ، دادگەری لە کوێ بێت ؟ ئەگەر وایە ، کێن ئەوانەی ئەم دەسەڵاتە بەڕێوەدەبەن و چۆن ڕێکخستراوەو ملکەچی چ بنەماو ڕێسایەکە ؟

ئازادیی ڕۆژنامەگەری یەکێکە لە ئازادییە گشتییەکان و لقێکە لە لقەکانی مافی مرۆڤ کە ئەو مافانەش لە ئەسڵدا مافی سروشتین و لەگەڵ سروشتی مرۆڤایەتی مرۆڤ دەگونجێن و بەرلەوەی مرۆڤ بێتە ناو دەوڵەت ئەم مافانەی هەن و هەر لەگەڵ لە دایك بوونییەوە دەیبێ‌و تەنانەت هەندێك لەو مافانە هەرلەو کاتەی کۆرپەلەیەو لە ناو سکی دایکی دایە سروشت پێی دەبەخشێت وەك مافی ژیان. بەلام دوابەدوای هاتنە ڕیزەوەی کۆمەڵ ، مرۆڤ بۆ ڕێکخستنی ماف و ئازادییەکانی بەمەبەستی پاراستنیان لە لە دەستدرێژی کەسانی‌تر پێویستی بە ڕێککەوتنێکی کۆمەلایەتی هەیە ، چونکە پرۆسەکردنی ئەم ماف و ئازادییانە بەبێ ڕێکخستن دەبێتە هۆی ڕوو بەڕوو بوونەوەو بەگژیەکداچوونیان ، چونکە بەرژەوەندیی هەریەکێك لەو ئەندامانەی کۆمەڵ ، خۆی لەخۆیدا ناکۆکە لەگەڵ بەرژەوەندی ئەوی‌تر. ڕاستیان وتووە ئازادیی هەرکەسێك لەو شوێنەوە دەست پێدەکات کە ئازادیی‌بەرامبەرەکەی لێ کۆتایی دێت . بەم شێوەیە بیرۆکەی دیالۆك و لێکحالیبوون و ئادابی قسەکردن دروست بووەو بەپێی ئەم ئادابە ئەگەر دوو کەس کەوتنە بەرامبەر یەك ، دەبێ

یەکێکیان گوێگر بێ تا ئەوی بەرامبەری قسەی خۆی تەواو دەکات ، ئەوجا ئەو قسە بکات و ئەویتر گوێگر بێت و بەم شێوەیە بیروڕاگۆڕینەوە دروست دەبێت.

کەواتە هەروەکو وتمان ، مرۆڤ بەئارەزوی خۆی دەستی لە هەندێك ماف و ئازادییەکانی خۆی هەڵگرتووە بەمەبەستی زامنکردنی بەشەکەی تری . ئەگەر وەهای نەکردبا دەبووە پاشاگەردانیو کەسیش خاوەن ماف نەدەبوو.

هەروەکو لەپێشەوە وتمان بەرژەوەندی هەرتاکێك لە تاکەکانی کۆمەڵ لەگەڵ بەرژەوەندی ئەویتر ناکۆکە چونکە هەرکەسێك لەوانە بە سروشت کۆمەڵێك غەریزەی هەیە وەك غەریزەی خۆ خۆشەویستی و چاولێکەری و شەڕانگێزی و چەندانیتر ، ڕادەو دەسەڵاتی ئەم غەریزانەش بەسەر کەسایەتیی مرۆڤەوە لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکیتر بە سروشت لێك جیاوازە و ئەم جیاوازییەی نیوان سروشتی کەسان وا لە مرۆڤ دەکات لە حاڵەتی سروشتیو دوور لە حوکمی یاسا و ئەقڵ ملکەچی ئەم غەریزانەی خۆی بێت و هەردەم بەرژەوەندی خۆی بخاتە پێش بەرژەوەندی کەسانیتر لە کاتی ناکۆك بوونی بەرژەوەندییەکەی لەگەڵ بەرژەوەندیی ئەواندا.

کەواتە ، بۆئەوەی کۆمەڵگایەکی ئاسوودەو سەقامگیر لە ئارادا بێت کە هیواو ئاواتی مرۆڤە و دەسبەرداری نابێت ، دەبێ ئەم ماف و ئازادییانە ڕێکبخرێن.

هەڵبەتە ئەم ڕێکخستنەش لە ڕێگای سنوردارکردنی ئەو ماف و ئازادییانەوە دەبێت ، وێڕای دانانی کۆمەڵێك ئەرك کە دەبێ هەرمرۆڤێك بۆ پرۆسەکردنی ئەو ماف و ئازادییانەی لە ئەستۆی خۆی بگرێت . کەواتە هیچ ماف و ئازادییەك بەبێ ئەرك نییە.

پانتایی ئەم ماف و ئازادی و ئەرکانە لەهەموو کۆمەڵگایەک وەکو یەک نین ، لە کۆمەڵگایەک بۆ کۆمەڵگایەکی‌تر دەگۆڕێن بەپێی گۆڕانی فەلسەفەی سیاسی‌و ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەو کۆمەڵگایە . کە دەڵێین ( کۆمەڵگا ) مەبەستمان کۆمەڵگای سیاسییە واتە وڵات.

لە وڵاتە سەرکوتکەرەکان ، بەچاوی کۆیلە تەماشای مرۆڤ دەکەن و بەکاریدەهێنن بۆ خزمەتی حوکمڕانان و هیچ سەنگێك بۆ ماف و ئازادییەکانی دانانێن ، بۆیە ئەوەندەی‌کە دانیشی پیانراوە شتێکی شەکلییەو بۆ خزمەتی خۆیان پێدا ناوە نەك خاوەنەکانیان .

بەڵام لە وڵاتە دیموکراسیخوازەکاندا ، ئەم تێڕوانینە جیایەو بەچاوی ڕێزەوە سەیری مرۆڤ دەکەن و بە بنچینەی کۆمەڵی دادەنێن ، بۆیە گشت هەوڵ و تەقەلایەك بۆ ئاسوودەیی‌و بەختەوەری ئەو دەخرێتەگەڕ. ئەمەش وادەخوازێ کە دان بە ماف و ئازادییەکانی لە فراوانترین بواردا بنرێت.

ئەمەی سەرەوە نموونەی دوو کۆمەڵگای سیاسیی لەیەك جیاوازن، لەیەکەمیان ماف و ئازادییەگشتییەکان بە ئازادیی ڕۆژنامەگەریشەوە بوونیان نییە ، و لەهی دووەمیشدا بواری ئەو ماف و ئازادییانە هێندە فراوانەو گەیشتۆتە ڕادەی موبالەغەکردن کە مەحاڵە لەم سەردەمە پڕ گرفت و کێشەو ئاڵۆزییەدا وەدی بهێندرێت

بۆیە دەبینین ، ئەمڕۆکە هیچ مافێك ڕەها نییە تاکو ئازادیی ڕۆژنامەگەری ڕەها بێت . بە ڵکو لە ڕووانگەی ئەخلاقی پیشەو داب و نەریت و بەرژەوەندییەباڵاکانی هەر کۆمەڵێك سنوور بۆ ئەم ئازادییە دانراوەو دەبێ ڕۆژنامەنووس پابەندیان بێت .

کەواتە ، دەتوانین بڵێین ڕوخسارەکانی ئازادیی ڕۆژنامەگەری لەم سەردەمەدا بریتییە لە ملکەچ بوون بۆ بنەماکانی موئافەسەو

ڕەچــاوکردنی داب و نــەریت و بەرژەوەندییــەبالاَکانی کۆمــەڵ و ئەخلاقی پیشەی ڕۆژنامەگەری .

بەم پێیە ، ئەمەریکا لــە پێشــەوەی ئــەو ولاَتانــە دێــت ، کەتیایاندا ڕۆژنامــە ئــازادەو ئــازادیی ڕۆژنامەگــەری لەســەر ئــەو بنەمایەی سەرەوەو دوور لە دەسەلاَت و دەست تێوەردانی حکومەت بەڕێوەئــەچێ. هــۆی ئەمــەش دەگەڕێتــەوە بــۆ دەسپێشــخەری نووسەران و هزرمەندانی ئەو ولاَتە بۆ بەرهەلَستیکردنی تــەوژمی سەرکوتکەری‌و چەوســانەوە . بــەلاَم لەبــەر ئیســتغلالکردنی ئــەم ئازادییــە لەلایەن ڕۆژنامەگەرییەوەو دەستدرێژیکردنیان بــۆ ســەر مافی‌خەلَك لــە ســەرەتای ســەدەی بیستەمدا بــە هــەولَ و تەقــەلاَی لیژنــەی ئــازادیی ڕۆژنامەگــەری لــە ئەمــەریکا تیۆریــی بەرپرســێتیی کۆمەلاَیەتی کە باشترین تیۆریی ڕۆژنامەگەرییە سەریهەلَدا.

بەپێی ئەم تیۆرییە هیچ ئازادییەك ڕەها نییــە بــەلَك و ئــەرك و بەرپرسێتیی کۆمەلاَیەتیی لەگەلَ دایەو دەبێ ئــەو کەســەی پرۆســەی دەکات لەخۆیەوە هەستی پێبکــات و بەرپرســێتیی ڕۆژنامەنووسیش لە چوارچێوەی ئەم بۆچوونەدا بەرپرسێتییەکی گریمانەکراوە.

کەواتە بەپێی ئەم تیۆرییە ، ڕۆژنامەگەری مافی ئەوەی هەیــە ڕەخنە لە حکومەت و دامودەزگاکان بگرێــت ، بــەلاَم لەهــەمان کاتدا چەندین بەرپرســیارێتی بنچینــەیی دیاریکراویشــی لەئەســتۆیە بــۆ ئاسوودەیی‌و سەقامگیریی کۆمەلَ دەبێ ڕەچاویان بکــات.

جا لــە ئاکامی ئــەم تیۆرییــەدا کــە ڕەواجێکی باشــی لــەلای حکومەتە سەرمایەدارەکانەوە هــەبوو ، لــە ئینگلَســتان و ئەمــەریکاو هــەندێ ولاَتی‌تــر، بــۆ دانــان و دیــارکردنی ئــەخلاقی پیشــەی ڕۆژنامەگــەری و سەرپەرشتیکردنی ئەنجومــەنی بــالاَی ڕۆژنامەگــەری دامــەزرا. هــەروەها میسرو لوبنــان و ســودانیش هەرچــەندە ولاَتــی

سەرمایەداری نینە و دیموکراسییەت و مافی مرۆڤیش تیایاندا وەکو پێویست بەرقەرارنەبووە بەلاّم سەرەڕای ئەمە ئەنجومەنێکی بالاّی ڕۆژنامەگەری وەك ئەو ولاّتانەو نیمچە سەربەخۆ بۆ بەڕێوەبردن و سەرپەرشتی پیشەی ڕۆژنامەگەری دامەزراوە تیایاندا.

هەروەکو لە پێشتر ئاماژەمان پێکرد ، ئەمڕۆکە باشترین تیۆر لە تیۆرییەکانی ڕۆژنامەگەری ( **تیۆریی بەرپرسیارێتیی کۆمەلاّیەتی** ) یە و ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە ولاّتە دیموکراسیخوازەکاندا لەبەر ڕۆشنایی ئەم تیۆرییە ڕێکخستراوە . هیچ گومانیشی تیا نییە ، هەروەکو چۆن ئەم تیۆرییە بەهەوڵ و تەقەلاّی لیژنەی ئازادیی ڕۆژنامەگەری و لە ئاکامی نووسینەکانی ولیەم کنج و جۆن ملتۆن لە ولاّتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا سەریهەلّدا ئەوەاش ئەو ولاّتە دەست پێشخەربووە لە شۆڕش دژی داگیرکەری ئینگلیزو پێش فەرەنساش پەیامی مافەکانی مرۆڤی دەرکردووەو لەم سەدەیەشدا پێشڕەوێتیی کۆمەلّگای نێودەولّەتی لەم ڕووەوە دەکات و داڕێژەری سیستمی جیهانی نوێیە ، ئەو سیستمەی کەلەسەر بنەمای مافی مرۆڤ و دیموکراسییەت دامەزراوە ، هەربۆیە شتێکی غەریب نیە کە دەستوری ئەمەریکی دان بەم ئازادییە بنێت و کەفالەتیشی بکات . هەرچەندە ، ئێمە پێمان وایە ، ئەمەریکا ئەوەندەی بە پەرۆشەوەیە بۆ دابینکردنی زۆرترین بڕی ئەو ئازادییانە بۆ هاوولاّتیانی خۆی هێندە باوەڕی بە ئازادیی گەلانیتر نیە . فشار خستنەسەر ئەمیری قەتەرو کەنالّی ئاسمانی جەزیرە بۆ دوورخستنەوەی فەیسەڵ قاسم لە پرۆگرامەکانی لە کۆتاییەکانی سەدەی ڕابردوو هەروەها قەدەغەکردنی پەخشکردنی وتارەکانی ئوسامە بن لادن ئەم بۆچوونەمان دەسەلمێنن .

ولآتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە یەکەمین هەمواری دەستورەکەیدا لە ساڵی ۱۷۹۱ لە ژێر ناوونیشانی بەڵگەنامەی مافەکانی مرۆڤ لە ماددە (۱) دا دانی بە ئازادیی ڕۆژنامەگەریدا ناوەو تیایدا هاتووە : (( کۆنگرێس بۆینیە هیچ یاسایەك دەربکات .. سنور بۆ ئازادیی وشە دابنێ ، یان ئازادیی ڕۆژنامەگەری ، یان مافی خەڵك بۆ کۆبوونەوە لە کەش و هەوای ئاشتیدا ، هەروەها لە بەرزکردنەوەی سکاڵا بۆ حکومەت بۆ لابردنی ئەشکەنجە )).

ئەگەر بێت و سەرنجی ئەم دەقە دەستورییە بدەین ، یەکەمجار وادێتەبەرچاو کە لە ولآتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئازادییەکی ڕەهای وشەو ڕۆژنامەگەری هەبێت و بەپێچەوانەی ئەویش لە هەندێ ولآتیتردا ئەم ئازادییە نەبێت . کەچی بە تێڕامان و قوڵ بوونەوە لە هۆی ئەم حوکمەو مەبەستی یاسادانەری ئەمەریکی ، ئەوکاتە بۆمان بەدەردەکەوێ کە مەسەلەکە وائاسان نییە تا بە ئا یان نا یان ئازادی هەیە یان نییە وەڵامی بدەینەوە ، بەڵکو لە هەموو ولآتێکدا سەرەڕای دانپیانان بەم ئازادییە، سنورێك لەبەردەم پرۆسەکردنیدا دادەندرێ و مەرج نییە تەنانەت ئەو بڕە مافەی کە دانیشی پیانراوە لە هەموو کات و ساتێکدا کاری پێبکرێت . بەلآم جیاوازی ولآتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ولآتانیتر لەڕووەوە لەوەدایە ، کە بەپێی حوکمەکانی دەستوری ئەمەریکی ، حکومەت بۆینیە بە ئارەزووی خۆی کۆت و بەند بەسەر ئەم ئازادییەدا بسەپێنێ ، بەڵکو سنوری دەسەلآتی لەم بارەیەوە دیارەو لە تەسکترین چوارچێوەدا بۆی هەیە ئەمە ئەنجام بدات.

کەواتە دەستەواژەی (( کۆنگرێس بۆینییە هیچ یاسایەك دەرکات .. سنور بۆ ئازادیی وشەو ڕۆژنامەگەری دابنێ .. )) ئەوە

دەگەیەنێ کە حکومەت بۆی نیە هیچ کۆت و بەندێکی پێشین لە بەردەم ئازادیی وشە دابنێ .

بەم پێیە مرۆڤ ئازادە چی بڵێ و چی بنووسێ و چی بڵاوبکاتەوە بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ حکومەت و ڕەزامەندی ئەو وەربگرێ لەسەر ئەوەی کە دەیڵێ یان دەینووسێ یان بڵاوی دەکاتەوە . بەڵام لەهەمان کاتدا ئەم ئازادییەی ئەوە ناگەیەنێ کە دوورە لە لێپرسینەوە . بەڵکو هەمووکاتێك دەبێ ئەوەی لە خەیاڵ بێت کە بەرپرسە لەسەر هەموو قسەیەك کە دەیکات یان دەینووسێ یان بڵاوی دەکاتەوەو ئەم بەرپرسێتیەشی گریمانەکراوەو دەبێ خۆی هەستی پێبکات .

ئەمەو هەروەکو لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد ، ئەم ئازادییەی ڕەهانییەو حکومەت بۆی هەیە لەهەندێ کاتدا بەمەبەستی هێمنیو سەقامگیری و ئاسایشی کۆمەڵ لە تەسکترین بواردا کۆتبەند لەسەر ئەم ئازادییە دابنێ . بۆنموونە لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی وڵات بۆ هێرش و پەلاماری دوژمن ڕێگە بەکەس نادرێ بەهیچ شێوازێك خەڵك هانبدەن بۆ یاخیبوون لە خزمەتی سەربازی و بەرگریکردن لە وڵات ، یان خستنەگەڕی ڕۆژنامەگەری بۆ ڕوخانی ورەی جەماوەرو پێشکەشکردنی خزمەتی سیخوڕی بۆ دوژمن . بەڵام قەتیش ڕێگەی قسەکردن و نووسین و بڵاوکردنەوەی لێناگیرێ ؛ بەڵام ئەگەر ئەم سنوورەی بەزاند ، خۆی تەحەمولی ئاکامەکانی دەکات و ڕووبەڕووی لێپرسینەوەو سزایەکی دوایین ( لاحق ) دەبێت لە ئاکامی ئەوقسەی کە کردویەتی یان نووسیویەتی یان بڵاوی کردۆتەوە.

لە هەقیقەتدا ، ئەم حوکمەی دەستوری ئەمەریکی ڕێك کۆکە لەگەڵ حوکمی شەریعەتی ئیسلامدا ، هەروەکو خوای گەورە

لەمڕووەوە دەفەرموێ : ﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ سورەتی الانسان، ئایەتی : ٣

بەهەرحاڵ ، جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان حاڵەتی دانانی کۆت و بەندو سانسۆری پێشینە ( رقابة سابقة ) لەسەر ئازادیی وشەو ئازادیی ڕۆژنامەگەری و حاڵەتی لێپرسینەوەی دواییینە ( لاحق ) . چونکە لە حاڵەتی یەکەمدا ، حکومەت کۆت و بەندو سانسۆر لەسەر ئەم ئازادییە دادەنێت و ڕێگا بە خاوەنەکەی نادات ئەو قسەیە بکات کە بە دڵی حکەمەت نییەو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیدا ناگونجێ . وە لەم حاڵەتەدا نهێنیی ئەم مەسەلەیە شاراوە دەبێت لە نێوان فەرمانبەرێکی حکومەت و خاوەن ڕایەك بۆئەوەی جەماوەرو ڕایگشتی ئاگادار بن و بتوانن قسەو باسی لێوەبکەن کە ئایا ئەوکەسە بەهەقیقەت سنوری ئازادیی بەزاندووە یان نا؟

بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا ، خاوەن ڕایەکە بەئاشکرا گوزارشت لە بیروڕای‌خۆی دەکات بۆئەوەی پێویستی بە ڕەزامەندی حکومەت بێت ، بەڵام لەهەمان کاتیشدا نابێ ئەوەی لەیاد بچێ کەئەم ئازادییەی لکاوە بە لێپرسینەوەیەکی کۆمەڵایەتی‌و هەردەم ڕووبەڕووی سزا دەبێتەوە ئەگەر سنوری ئەم ئازادییە ببەزێنێ‌و لەو هێڵە سوورانە بدات کە کۆمەڵ بۆی‌داناون وەیان ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری وەك بەشێك لە ئەخلاقی پیشەی ڕۆژنامەگەری دوور لە دەسەڵاتی حکومەت بۆی داناون.

بێگومان جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان هەردوو حاڵەتدا. لەحاڵەتی یەکەم ، ئەگەری خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات لەلایەن حکومەتەوە دژی ئازادیی ڕۆژنامەگەری دەکرێ‌و لەوانەیە حکومەت دەسەڵاتی خۆی خراپ بەکاربهێنێ‌و دژی هەموو بیروبۆچونێك

بوەستێ کە دژی ڕەوتی ئەو بێت ، بەمەش ڕۆژنامەگەری نەیار ( معارض ) و بیروڕای جیاواز لەناو کۆمەڵ دروست نابێت ، ئەمەش خۆیلەخۆیدا ئەوەئەگەیەنێ کە بەشێکی زۆری هێزوتوانای هزریی ئەندامەکانی کۆمەڵ هەر بە شاراوەییو بێ ئیستسمار دەمێنێتەوەو سوود لە گشت هەوڵ و تواناکانی مرۆڤ وەرناگیرێو پێشکەتنیش تا ڕادەیەکی زۆر دەوەستێ . بەلام لە حالەتی دووەمدا هەرچەندە حکومەت دەسەلاتی دانانی کۆت و بەندو سانسۆری پێشینی لەسەر ئازادیی وشەو ئازادیی ڕۆژنامەگەری نیە بەلام سەرەڕای ئەمە دوای بلاوکردنەوەی مافی لێپرسینەوەو سزادانی ئەرکەسانەی هەیە کە سنوری ئەم ئازادییە دەبەزێنن . وەلەم حالەتەشدا حکومەت ناتوانێ دەسەلاتی خۆی بەخراپی بەکاربهێنێت ، چونکە چاویگەل کراوەیەو چاودێرە بەسەریەوە .

شایەنی ئامارەبۆکردنە ، دەستەواژەی (( **کۆنگرێس بۆینیە هیچ یاسایەك دەرکات سنور بۆ ئازادیی وشە ، یان ئازادیی ڕۆژنامەگەری دابنێ** )) ، ئازادیی ڕۆژنامەگەری ئەخاتە نێو قوولایی دەستوری ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا ، ئەم بەلگەنامەیەش پەیکەری حوکمڕانێتی پێك دێنێت هەروەها بنچینەیە بۆ یاساکانی ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا .

دەستوری ئەمەریکی لەدانانی چوارچێوەی حکومەتی ئەمەریکیدا هاوسەنگییەکی لە نێوان دەسەلاتی یاسادانان ، و دەسەلاتی جێبەجێکردن ، و دەسەلاتی دادگەری ڕاگرتووە .

دەسەلاتێکی جیاوازو سەربەخۆی داوە بە هەریەکێك لەم دەستەگشتییانە . مەبەستیش لە دابەشکردنی دەسەلات لە نێوان ئەم دەستە گشتییانەدا بە شێوەیەکی جیاوازو سەربەخۆ دانانی سیستمێکە ، دابەشکردنی دەسەلات لەنێوان دەستەکانی

حوکمڕانێتی ، تیایدا بەشداری دەکات لە هێمنی و ئاسوودەیی و سەقامگیریی.

وە بەپێی یەکەمین هەمواری دەستوری ئەمەریکیی ساڵی ۱۷۹۱ کەتایبەتە بە بەڵگەنامەی مافەکانی مرۆڤ ، هەر لەو ڕۆژەوە ڕۆژنامەگەری بووە هێز و خاوەن ڕای‌خۆی . ئەمڕۆکەش ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا زۆرجاران بە دەسەلاتی چوارەم ناوی ئەبردرێت و هەربەم ناوەش دەناسرێت ، ئەم ناوەش ئەوە دەگەیەنێ ، کە ڕۆژنامەگەری لەو ولاتەدا شان بەشانی سێ‌دەسەلاتەکەی‌تر بەشداری دەکات لە حوکمڕانێتی ولات .

کێشە ئابڕووبەرەکەی (( وەتەرگێت )) باشترین نموونەی هێزی ڕۆژنامەگەرییە وەك دەسەلاتێکی چوارەم لە ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

ئەم کێشەیە ، دوو ڕۆژنامەنووسی ئەمەریکی لە ڕۆژنامەی ((واشنتۆن پۆست )) ورووژاندیان و ئاشکرایان کرد ، بووەهۆی دەست لەکارکێشانەوی سەرۆکی پێشوی ئەمەریکی نیکسۆن ، و دەرچونی لە کۆشکی سپی بەرلەوەی ماوەی سەرۆکایەتییەکەی تەواوبێت .

ئەگەر بێت و سەرنجی ئەو برگە جیاجیایانەی یاسای ئەمەریکی سەبارەت بە دانانی کۆت و بەند لەبەردەم ئازادیی ڕۆژنامەگەری بدەین و بەراوردی بکەین لەگەڵ پانتایی ئەو ململانێ زۆرو درێژخایەنەی کە ڕۆژنامەگەری لەگەڵ حکومەت دەیکات بێ‌ئەوەی ڕوویەڕووی لێپرسینەوە بێت ، دەبینین دادگا وەك دەسەلاتێکی سەربەخۆ ، هەروەکو لە ماددە سێی دەستوری ئەمەریکیدا هاتووە ، هەمیشە پاڵپشتێك بووە بۆ دەسەلاتی ڕۆژنامەگەری‌و باشترین زەمانیش بووە بۆ ئەم ئازادییە .

ئەوکێشە گرینگانەی کە بەرزبوونەتەوە بۆ بەردەم دادگا ڕێگـا خۆشکەر بوون بـۆ پتـەوکردنی ئـازادیی ڕۆژنامەگـەری ، کـە تایبـەت بـوون بـە بـە دواداچوونـی زانیـاریو بڵاوکردنـەوەی بەڵگەنامـە حکومییەکان یان ئەو زانیارییانەی کە کەسایەتییەگشتییەکان لەبەر چاوی خەڵك دادەبەزێنێ . بۆنموونە ، دادگای باڵای ئەمەریکی خـۆی خستەپاڵ ڕۆژنامەگـەری دژی حکومـەت لـە مەسـەلەی ڕێگـادان بـە ڕۆژنامەکان بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو بەڵگەنامە حکومیانەی کە دواتر بە بە بەڵگەنامەکانی (( پنتاگۆن )) ناسران.

ڕۆژنامـە ئەمەریکاییـەکان ئـەم بەڵگەنامـە نهێنیانـەی شـەڕی ڤێتنام دوایئەوەی کە بەشێوەیەکی نارەسمی وەدەسـتیان کـەوت و سەرەڕای لاری حکومەت بڵاویانکردەوە .

هەروەهـا دادگـای بـاڵای وڵاتەیـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا بەپێی یەکەمین هەمواری دەستور بڕیاری لەسەر چەند حەسانەتێك لـە یاسـاکانی نـاوزڕاندن دا ، بۆئـەوەی ڕۆژنامەگـەریو دەزگاکـانی ڕاگەیاندن دەسهەڵگرن لـە بڵاوکردنـەوەی تـەواوی ئـەو ڕاپۆرتانـەی کەتایبـەتن بـە کاروبارەگشـتییەکان بـۆ ڕزگـاربوون لـە ڕووبەڕووبوونەوەی داوای دادگاییو ئەگـەری دەفعکردنـی قـەرەبووی دارایی . وە بۆئەوەی کەسایەتییەکی گشتی دەعـوای نـاوزڕاندن لـە ڕۆژنامەیەك یان هەر کەناڵێکی ڕاگەیاندن بباتـەوە ، دەبـێ بوونـی (( نیازخراپی)) لە پشت ئەم بڵاوکردنەوەیە بسەلمێنێ.

ئەمەو دادگاکان بڕیاریـان دا کـە ئەوکاتـە (( نیـازخراپی)) لـە پشت بڵاوکردنەوەکەدا دەبێ کە بابەتەکەی بڵاوکردۆتەوە بزانێ ئـەو زانیاریانەی بڵاویکردوونەتەوە درۆیە یان لە ئـەنجامی کەمتەرخـەمی ئەو ڕۆژنامەیە یان کەناڵەوە بووە کـە لـە بڵاوکردنـەوەی ئـەو بابەتـە

تەئکیدی نەکردووە کە ئایا ئەو زانیاریانە ڕاست و دروستن یان نادروست .

هەڵبەتە ئەرکی سەلماندنی (( نیازخراپی )) ڕۆژنامەو کەناڵەکان لە بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان ئەرکێکی قورسەو دانانی ئەم ئەرکە لە ئەستۆی کەسایەتییە گشتی‌یەکان خۆی‌لەخۆیدا خزمەتکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری‌و پاراستنیەتی لە دەسەڵاتی حکومەت .

ئەمەو سەربەخۆیەتی ڕاستەقینەی دادوەرانی فیدراڵی لە ئەمەریکا ڕەگەزێکی سەرەکییە بۆ پەرەپێدانی ئەو حەسانەتە یاساییانەی کە ڕۆژنامەگەری‌و کەناڵەکانی تری ڕاگەیاندن سوودی لێوەردەگرن . سەرۆکی وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا دادوەرانی فیدراڵی بە ڕەزامەندی ئەنجومەنی پیران دادەمەزرێنێ . بەڵام دوای دەرچوونی ڕەزامەندی لەسەر دامەزراندنیان، ئەوکەسانە تاکو مردن لە پلەو پایەی خۆیان سدەمێننەوە ، و پارێزراویشن لە ئەگەری هەر پاڵەپەستۆیەکی دەرەکی کە ڕەنگبێت لە لایەن بەرپرسێکی حکومەت یان دەسەڵاتی یاساییەوە بخرێتە سەریان ، هەروەها نابێ مووچەو دەرماڵەیان کەم بکرێتەوە یان لەبەر ئەم هەڵوێستەیان پلەو پایەیان لێ بسێندرێتەوە .

بەم پێیە ، سەرەڕای ئەوەی کەلە دەستوری ئەمەریکا ئازادیی ڕۆژنامەگەری وەك دەسەڵاتێکی گشتی ناوی نەهاتووە ، بەڵام دوابەدوای یەکەمین هەمواری ساڵی ١٧٩١ و دەستەبەرکردنی گرێنتی بۆ ڕێگاگرتن لە کۆنگرێس بۆ سنوردارکردن و دانانی کۆت و بەند لەبەردەم ئازادیی ڕۆژنامەگەریداو هەروەها دەستەبەرکردنی حەسانەتی دادگەری لەلایەن دادگای باڵاو دادگاکانی‌تری ئەمەریکی ، دەتوانین بڵێین ئازادیی ڕۆژنامەگەری هیچی لە سێ

دەسەڵاتەگشتییەکەی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادگەری کەمتر نییەو بەڵکو لە هەندێ کاتدا لەوانیش کاراترو کاریگەرترە ، چونکە چۆن چاودێرە بەسەریانەوە ئەوهاش کارگەرێتیی هەیە لە دروستکردنی ڕای‌گشتی‌و دروستکردنی بڕیارە سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و یاساییەکانی وڵات ، هەربۆیە هەندێ کەس تەنانەت بە دەسەڵاتی دووەم ناوی دەبەن .

دوابەدوای ئەوەی کە بۆمان دەرکەوت لە ئەمەریکاو ئەو وڵاتانەی باوەڕیان بە دیموکراسییەتێکی ڕاستەقینەو تەواو هەیە ، ئازادیی ڕۆژنامەگەری دەسەڵاتێکی سەربەخۆو جیاوازە لە سێ دەسەڵاتە گشتییەکەی تری وڵات ، باابزانین کێن ئەوانەی ئەو دەسەڵاتە بەڕێوەدەبەن و ئەو بنەمایانە کامانەن کە کاری ئەم دەسەڵاتە ڕێك دەخەن .

لە ئەمەریکاو ئەو وڵاتانەی کە ڕێچکەی ئەویان گرتۆتەبەر بۆ دەستەبەرکردنی زۆرترین بڕی ئازادی بۆ وشەو ڕۆژنامەگەری ، هەروەها بەمەبەستی پاراستنی ڕۆژنامەگەری لە دەست تێوەردانی حکومەت و دەسەڵاتی یاسادانان و دەستەبەرکردنی زۆرترین بڕی ئازادیی بۆ پرۆسەکردنی ڕۆژنامەگەری ، لە ڕێگای ئەنجومەنێکی باڵای ڕۆژنامەگەرییەوە ئەم دەسەڵاتە بەڕێوەدەچێ ، هەروەها لە ڕێگای دانانی کۆمەڵێك بنچینەی ئەخلاقییەوە کە پێی دەوترێ (( بەڵگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەگەری )) کە لەلایەن ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەرییەوە دادەندرێن بۆ پرۆسەکردنی ئەم پیشەیە ، کاری ڕۆژنامەگەری ڕێك دەخسترێ .

لە خوارەوە ، لەدوو خاڵدا باس لەم مەسەلەیە دەکەین . لە خاڵی یەکەمدا باس لە چۆنێتی دامەزران و پەیکەری ڕێکخستنی ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری دەکەین و ئەنجومەنی باڵای

ڕۆژنامەگەری لوبنانی بە نموونە دەهێنینەوە ، و لە خاڵی دووەمیشدا باس لە بەڵگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەگەری دەکەین و بەڵگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەگەری نێودەوڵەتی بە نموونە دەهێنینەوە :

## ٢ - ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری

بەمەبەستی زامنکردنی سەربەخۆیی‌و ئازادیی ڕۆژنامەگەری و پاراستنی لە دەستدرێژی‌و فشاری حکومەت و دەسەڵاتی یاسادانان ، لە ئەمەریکاو بەریتانیاو هەندێ وڵاتی‌تر کە باوەڕیان بە جۆرێک لە جۆرەکانی دیموکراسییەت هەیە وەك میسرو لوبنان لە ڕێگای دامەزراندنی ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەرییەوە ئیش و کارەکانی ڕۆژنامەگەری لە وڵاتدا بەڕێوەدەچێ.

لە ئەمەریکاو بەریتانیا ڕۆژنامەنووسان خۆیان لە ڕێگای هەڵبژاردن لە کەش و هەوایەکی ئازاددا سەرۆك و ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە هەڵدەبژێرن و ، ئەم ئەنجومەنە لە پێکهاتنیدا جیاوازە لە سەندیکای ڕۆژنامەنووسان و ماوەی ئەندامێتییەکەشی دیاریکراوە .

ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری دەستەیەکی سەربەخۆیە بەکاروباری ڕۆژنامەگەری هەڵدەستێ بەشێوەیەك کە ئازادی و سەربەخۆییەکەی لە چوارچێوەی یاسادا بپارێزێ ، وە لە نێوان دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری گرتنەبەری هەموو ئەوشتانەی پەرە بە ڕۆژنامەگەریی ئەدەن و پێشی‌دەخەن و پاڵپشتی دەکەن بە شێوەیەك کە شان بە شانی پێشکەوتنی زانستی لە بوارەکانی ڕۆژنامەگەری بڕوات و هەروەها وادەکات بگاتە فراوانترین ناوچە ، هەروەها کاری ڕۆژنامەگەریی دەپارێزێ و کەفالەتی مافی ڕۆژنامەنووسان دەکات و زامنی هەستانیان بە

کاروپیشەکانیان دەکات و بەڵگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەگەری دادەنێت لەگەڵ ئەو ئەو بنچینانەی زامنبوونی ڕێزگرتن و جێبەجێکردنی کەفالەت دەکەن .

کەواتە ئەم ئەنجومەنە سەرپەرشتی کاری ڕۆژنامەگەری دەکات لە وڵاتدا ، و هەڵدەستێ بە دانانی بەڵگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەگەری کە بریتییە لە کۆمەڵێك پرینسیپ و بنچینەی ئەخلاقیی تایبەت بە پیشەی ڕۆژنامەگەری و دەبێ ڕۆژنامەنووس و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن پابەندیان بن ، ئەگینا ڕووبەڕووی لێپرسینەوە دەبن لە لایەن ئەم ئەنجومەنەوە . بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە لە خوارەوە تیشك دەخەینە سەر ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەریی لوبنانی وەك نموونە .

## ٢ ١ ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەریی لوبنانی

لە یاسای چاپەمەنی لوبنانی ١٩٦٢/٩/١٤ هەموارکراو لە فەسڵی چوارەم لەژێر ناونیشانی (( ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری )) لە ماددە / ٩٥ دا هاتووە :(( دەستەیەك لە یەكێتیی ڕۆژنامەگەریی لوبنانی هەڵئەقوڵێ پێی دەوترێ ( ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەری) ئەم ئەنجومەنە لە نوسینگەی هەردوو سەندیکای خاوەن ڕۆژنامەکان و سەندیکای ڕۆژنامەنووسان و دوو ئەندام لە هەریەکێك لەو دوو سەندیکایە کە ئەنجومەنەکەی هەڵیان دەبژێرێ بۆماوەی ساڵێك پێك دێت ، بەلایەکەمی مانگی جارێك کۆدەبێتەوە یان لەکاتی داخوازی ئەنجومەنی یەکێك لەو دوو سەندیکایە .

سەرۆکی دەزگای ڕۆژنامەگەری و کاروباری یاسایی لە وەزارەتی ڕاگەیاندن نوێنەری حکومەتە لە ناو ئەم ئەنجومەنەو هەموو ئەو لیژنەو دەستانەی لێی هەڵدەقوڵێن .

هەروەها سەرۆكی بەڕێوەبەرێتیی ڕۆژنامەگەری لە دەزگای ناوبراو بڕیاردەری لیژنەی ناوبراو لە مادده/ ٩٧ دەبێت )) .

# ٣ - بەڵگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەگەریی

## ٣ ١ بەڵگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەگەریی كوردستانی

هەرچەندە سەندیكای ڕۆژنامەنووسانی كوردستانی عێراق وەكو ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەریی میسری و لوبنانی بەڵگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەگەریی بەشێوەیەكی سەربەخۆ دەرنەهێناوە ، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە پرینسیپ و بنچینەكانی ئەخلاقی پیشەی ڕۆژنامەگەریی بۆ ڕۆژنامەنووسان دیار نەكردبێت . بەڵكو لە زمنی یاسای سەندیكای ڕۆژنامەنووسانی كوردستانی عێراق ژمارە ( ٤ ) ی ساڵی ١٩٩٨ لە ماددەی بیستەمدا لەژێر ناونیشانی پابەندییەكان لە دەخاڵدا تۆماری كردووە بەم شێوەیەی خوارەوە :

دووەم : پابەندییەكان :

نابێ ڕۆژنامەنووس ئەم كارانە بكات :

١ ئەوەی دەسەڵاتەكانی لێكۆڵینەوە ، یان دادگاكان گرتویانەتە ئەستۆ كە كاردەكاتە سەر ڕێڕەوی لێكۆڵینەوە یان دادگایی كردن .

٢ ئەنجامدانی ئەو پیشەیە بەبێ تازەكردنەوەی بەشداربوون لە سەندیكادا بەپێی ئەم یاسایە .

٣ بەكارهێنانی هەرهۆیەك یان ڕێگەیەك بەمەبەستی قازانجی ناڕەوا.

٤ وەرگرتنی پیتاك بەبێ ڕەزامەندی ئەنجومەن .

٥ ناوبانگ زڕاندنی پیشەکەو ئاشکراکردنی نهێنییەکانی یان هەرەشەکردن لە هاونیشتمانییان بەهەر ڕێگاو شێوەیەك بێ لە شێوازەکانی ڕۆژنامەنووسی .

٦ شلۆقکردنی موتمانە بە سیستمی فیدرالی لە کوردستانی عێراقداو شێواندنی ئاسایشی هاوولاتییان بە ڕێگای ڕاستەوخۆبێ یان ناڕاستەوخۆ ، هەروەها وروژاندنی غەریزەکانی جەماوەر بەهەر ڕێگایەك بێت .

٧ قۆستنەوەی وشەی نووسراو یان نێردراو قۆستنەوەیەکی (تایبەتی ) بۆ سوودی تایبەتیو زیان بەخش بێ بەخەڵکیتر ، یان خۆ لە خەڵك گۆڕین ( انتحال صفة ) یان هەڵگرتنی فیکرەیەك و زەرەرگەیاندن بە ڕەوشت و نیزامی گشتی .

٨ بەهەڵەبردنی جەماوەر بە زانیاری نادروست و لێکدانەوەی ڕووداوەکان ، بەجۆرێك دووربێ لە دەستپاکی یان بلاوکردنەوەی نادڵنیایی لێیان .

٩ وەرگرتن و هەڵێنجان ( اقتباس ) لە بەرهەمی کەسانیتر بەبێ ئامازەکردن بۆ خاوەنەکەی یان سەرچاوەکەی .

١٠ قۆستنەوەی ڕۆژنامەنووسیی بۆ تانەلێدان و سووکایەتی کردن بە پیرۆزە ئایینی و نیشتمانییەکان.

## ٣ ٢ بەڵگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەگەریی نێودەوڵەتی

بەڵگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەگەریی نێودەوڵەتی لە لایەن لیژنەی ئازادیی ڕاگەیاندنی سەر بە ڕێکخراوی یۆنسکۆ دانراوەو لە خولیی چواردەهەمینی ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٥٢ دانی

پیادانراوەو حوکمەکانی بە بەشێك لە یاسای گشتیی نێودەوڵەتی دادەندرێن و دەبێ ڕۆژنامەنووسان خاوەن ڕۆژنامەکان پابەندیی بن .

لە پێشەکی ئەم بەڵگەنامەیەدا هاتووە : (( ئازادیی ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندن مافێکی بنەڕەتییە لە مافەکانی مرۆڤ و سەنگی مەحەکە بۆ گشت ئەو ئازادییانەی کە بەڵگەنامەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەیان درکێنێ و جاڕنامەی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ دەقنووسیان دەکات و هۆکارێکی سەرەکیشە بۆ سەقامگیربوونی ئاشتی .

لەهەموو ئەوانە گرینگتر بۆ کەفالەتی ئەم ئازادییە دەبێ کارمەندانی ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندن لە کاتی گوزارشتکردنی بیروڕایاندا گشت توانایەکیان بخەنەگەڕ بۆ خۆبەدوور خستنەوە لە سوکایەتی پێکردنی کەسان و شتە پیرۆزەکان کە خۆیان تەحەمولی ئەنجامەکانی دەکەن و دەبێ هەمیشە ڕشتبن لەسەر بەرپرسێتیی ئەدەبی کە وایان لێ دەخوازێ کە دەست پاك و ڕاستگۆ بن لە دەقنووس و ڕاڤەو لێکدانەوەی ڕووداوەکان .

دواتر ئەم بەڵگەنامە نێودەوڵەتییە وەك یاسایەك دانراوە بۆ ڕەفتاری پیشەیی هەرتاکێك داوای لێکرابێت بەدوای هەواڵ و زانیاریدا بکەڕێ یان بیگوێزێتەوە یان پەخشی بکات و بەدوایان دا بچێ یان ئەرکی وەسفکردنی ئەو ڕووداوانەی کە ڕووئەدەن پێی بسپێردرێ جا ئەو وەسفە بە نووسین بێت یان بە قسە وەیان بەهەر ڕێگایەکی تری گوزارشتکردن بێت )) .

**ماددەی یەکەم :**

دەبێ کارمەندانی ڕۆژنامەگەریو ڕاگەیاندن ئەوەی لە توانایان دایە بیخەنەگەڕ بۆ بەخشینی هەواڵی ڕاست و دروست بۆ جەماوەرو موتابق بێت لەگەڵ ڕووداوەکان هەروەها دەبێ لە ڕاستی

ئەوزانیاریانەی کە وەدەستیان دەکەوێ بکۆڵنەوەو نابێ هیچ ڕوداوێکی گرینگ لەبیر بکەن یان ڕوداوەکان بەئەنقەست بشێوێنن.

ماددەی دووەم :

پرۆسەکردنێکی شەریفانەی ڕۆژنامەگەری ، دڵسۆزی بۆ بەرژەوەندیی گشتی دەخوازێ ، لەبەرئەوە دەبێ ڕۆژنامەنووسان دوور بکەونەوە لە کۆششکردن بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی تایبەتی یان پشتگیریکردنی بەرژەوەندییەکی ناکۆک لەگەڵ بەرژەوەندییەکی گشتیدا ، هۆیەکان و دافعەکان هەرچیەك بن .

ناوزڕاندنی بە ئەنقەست کە پشت بە بەڵگە نابەستێ یان گۆڕینی قسەی کەسان ، بەهەڵەی پیشەیی ترسناك دادەندرێت و نیازپاکیو دڵسۆزیش بەرامبەر جەماوەر بە بنچینەی ڕۆژنامەگەریی بەڕێز و شایەن بە ناوەکەی دادەندرێت و هەرهەواڵێك دوای پەخشکردنی دەرکەوت درۆیە و زیانبەخشە دەبێ لەخۆوەو بەزوویی ڕاست بکرێتەوە ، هەروەها دەبێ ئەو پڕوپاگاندەو هەواڵانەی کە بێبەڵگەن دابڕێژرێنەناو قاڵبێکی وەهاوە کە سروشتی ڕاستەقینەی خۆیانی پێوەدیاربێت .

سێیەم :

کارمەندانی ڕۆژنامەگەریو ڕاگەیاندن دەبێ کارێکی وەهایان بۆخۆ یان بۆ غەیری خۆیان نەوێ کە لەگەڵ دەسپاکیو کەرامەتی پیشەکە نەگونجێ . وە دەبێ ئەم بنچینەیە بچەسپێ لەسەر هەموو ئەو کەسانەی بەشداری لە کارەکانی ئابووریو بازرگانی کە پەیوەندیی بە پیشەی ڕۆژنامەگەرییەوە هەیە دەکەن و دەبێ

ئەوانەی پەخشی هەواڵ دەکەن وەیان تەعلیق دەنووسن تەواوی ئەو بەرپرسیارێتییە تەحەمول بکەن کە لە ئاکامیدا دێتەکایەوە ، مەگەر پێشەکیو بە ڕاشکاوەیی تەحەمولکردنی ئەم بەرپرسیارێتییەیان ڕەتکردبێتەوە .

وە هەریەکێك تۆمەتێکی درابێتەپاڵ لەڕوی ناووناوبانگ یان ڕەوشتییەوە مافی بەرپەرچدانەوەی ئەو تۆمەتانەی هەیە کە لەوانەیە لەناو هەواڵەکان یان تەعلیقەکاندا بێت .

کەواتە دەبێ ڕێزگرتنی ناوبانگی خەڵك بنچینەیەك بێت لە بنچینەکانی پیشەی ڕۆژنامەگەریو نابێ تەعەڕوزی ژیانی تایبەتیان بکرێ وەیان ناوبانگیان بزڕێندرێ مەگەر بەرژەوەندیی باڵا وابخوازێت هەروەها لە ئەرکەکانی ڕۆژنامەنووس پاراستنی نهێنیەکانی ئەو سەرچاوانەی کە زانیاریەکانی لاوەردەگرێ ئەو زانیاریو هەواڵانەی کە هەندێ سەرچاوەی نهێنی بۆ کارمەندانی ڕۆژنامەگەری درکاندبوونیان نهێنیەتی پیشەی ڕۆژنامەگەری کە ڕۆژنامەنووس بۆی هەیە سپشت بە یاسا ببەستێ بۆ پاراستنی دەیانگرێتەوە .

ماددەی چوارەم :

ئەو ڕۆژنامەنووسانەی کە دەیانەوێ ئەو ڕوداوانە بنووسن و تەعلیقیان لێبدەن کەکەوتونەتە ولاتێکی غەیری ولاتی خۆیان دەبێ ئەو زانیاریانەی کە دەرفەتی نووسین و تەعلیقیان لەسەر ئەو ڕوداوانە بۆ دەڕەخسێنێ ڕاستیو دادپەروەری وەدەست بهێنن.

**ماددەی پێنجەم :**

بەپێی ئەو پرینسیپەی ئەم بەڵگەنامەیە پشتی پێبەستووە بەرپرسیاریێتی کەفالەتکردنی ڕێزو شەرەفی پیشە دەکەوێتە ئەستۆی کارمەندانی ڕۆژنامەگەری نەک حکومەتەکان . بۆیە نابێ هیچ بەندێك لە بەندەکانی ئەم بەڵگەنامەیە بەچەشنێکیوا لێك بدرێتەوە ڕێگا بە دەستێوەردانی حکومەتەکان بدات ئەو دەستێوەردانە هەرچ جۆرێك بێت بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە ئەدەبیانەی لەم بەڵگەنامەیەدا هاتوونە .

شایەنی ئاماژەبۆکردنە ، چونکە بەڵگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەگەری پێوەرەکانی لە جاڕیی گەردوونیی مافی مرۆڤ وەرگرتووە کە ئەویش بەدەوری خۆی بۆ پەیمانی نێودەوڵەتی بۆ مافەشارستانی و سیاسیەکانی ساڵی ١٩٦٦ بنچینە بووە، بۆیە دەبێ ڕۆژنامەنووس پابەندی ئەوانیش بێت .

## ئەنجام :

لە ئەنجامی ئەم تۆژینەوەیەدا گەیشتینە ئەم ئاکامانەی خوارەوە :

١ ئازادییەکی ڕەهای ڕۆژنامەگەری لە هیچ ولاّتێکدا نییە ، بەلاّم جۆرو قەوارەی کۆت و بەندەکانی لە سیستمێکەوە بۆ سیستمێکی تری فەرمان ڕەوایی دەگۆڕێ .

لە ولاتە دیموکراسیخوازەکاندا دەخرێتە نێو قالّبی ئەخلاقی پیشەی ڕۆژنامەگەرییەوەو ، ڕۆژنامەنووسان لە ڕێگای ئەنجومەنەکانیانەوە خۆیان بۆ خۆیان دایدەنێن و پابەندیشیان دەبن.

بەلام لە ولاّتە سەرکوتکەرەکان ئەم ئازادییە بە ڕۆژنامەنووسان و ڕۆژنامەگەری نادرێ و هەموو کاتێك موعەڕەزن بۆ دەستێوەردان لە ئیش و کارەکانیان و سەرکوتکردنەوەیان لە لایەن حکومەتەوە .

٢ ئەمەریکا لە پێشەوەی ولاّتە دیموکراسیخوازەکانی جیهان دێت بۆ بەرقەرارکردن و زامنکردنی ئازادیی ڕۆژنامەگەری . لەناو

دەستوردا ئەمەی بەرجەستە کردووەو هەنگاوی عەمەلیشی بۆ هاویشتووە .

٣ پێکهێنانی ئەنجومەنێکی باڵای ڕۆژنامەگەری لە ڕێگای هەڵبژاردنێکی ئازاد و بێ دەستێوەردان گەورەترین زامنە بۆ سەربەخۆیی و ئازادیی ڕۆژنامەگەری .

٤ سەرەڕای ئەو هەوڵ و تەقەلاَیانەی لە لوبنان و میسردا بۆ ئازادی و سەربەخۆیی ڕۆژنامەگەری دراوە، کەچی هێشتان ڕۆژنامەگەری هەر دیلی دەسەلاَتە ، مادامەکینێ لەو ولاَتانەدا وەزارەتی ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنوسانی حکومی هەنەو پێکهێنانی ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەگەریش هەر بە ڕواڵەتییە .

٥ بەرلەوەی بیر لە داڕشتنی بەڵگەنامەیەك بۆ شەرەفی پیشەی ڕۆژنامەگەری بکەینەوە کە پێی دەڵێن (( ئەخلاقی پیشە )) دەبێ ڕۆژنامەنووسان لە مافەکانی مرۆڤ وشیار بکرێنەوە ، ئەوکاتە هەستی بەرپرسیارێتیی ئەخلاقیان لا دروست دەبێ بێئەوەی ڕاپیگەیەنن و دەشزانن چۆن پابەندی بن .

## سەرچاوەکان :

### کتێب :


١ - قورئانی پیرۆز

٢ - د . ابراهيم الداقوقي : قانون الاعلام ، منشورات جامعة بغداد ، مطبعة وزارة الاوقاف والشؤون الدينية ، ١٩٨٦.

٣ - د . بسيوني ابراهيم حمادة : دور وسائل الاتصال فى صنع القرارات فى الوطن العربي : ط/١ ، منشورات مركز دراسات الوحدة العربية ، بيروت لبنان ، ١٩٩٣ .

٤ - د . جيهان المكاوي : حرية الفرد و حرية الصحافة ، ط/١ ، منشورات الهيئة المصرية للكتاب ، ١٩٨١ .

٥ جون . ار . بيتنر : مقدمة فى الاتصال الجماهيري ، ترجمة مركز الكتب الاردني ، عمان ، ١٩٩٠

٦ حەمەکەریم عارف : ڕاگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا ، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای موکریانی ، چاپی یەکەم ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ، هەولێر ، ٢٠٠١ .

٧ - حامد محمد علي : حول الاعلام و الاعلام الاسلامي ، ط/١ ، منشورات مكتب الاعلام للاتحاد الاسلامي فى كوردستان ، مطبعة الثقافة ، اربيل ، ١٩٩٨ .

٨ د . سـعيد عبدالكـريم مبـارك : اصـول القـانون ، ط/١ ، منشورات جامعة بغداد كلية القانون و السياسـة ، مطبعـة دار الكتب للطباعة والنشر ، بغداد .

٩ د . صبحـي المحمصـاني : أركـان حقـوق الانسـان ، ط/١ ، منشورات دار العلم للملايين ، بيروت لبنان ، ١٩٧٩

١٠ د . عبداللطيف حمزة : الاعلام له تأريخه و مذاهبه ، ط/١ ، منشورات دار الفكر العربي ، القاهرة ، بلا سنة طبع

١١ - د . منذر الشاوي : الدولة الديموقراطية ، ط/١ ، منشورات المجمع العلمي العراقي ، مطبعة دار الكتب للطباعة والنشر ، بغداد ، ١٩٩٨

١٢ - د. محمد متولى و لطفي عبد القادر : الاعلام و حرية المجتمع في موكب التاريخ ، ط/١ ، منشورات نهضة الشرق ، جامعة القاهرة ، ١٩٨٧

١٤ - هارولد. ج . برمان : احاديث عن القانون الامريكي، ترجمة نور محمد فتح الله الخطيب و الدكتور مصطفى احمد فهمي ، ط/١ ، منشورات مركز كتب الشرق الاوسط ، مؤسسة فراكلين للطباعة والنشر ، القاهرة ، ١٩٦٤ .

## ڕۆژنامەو گۆڤار :

١٥ ڕۆژنامەی ( نداء المستقبل ) .

١٦ ڕۆژنامەی ( الاتجاه الاخر ) .

١٧ - ڕۆژنامەی برایەتی .

١٨ - گۆڤـاری ( الحقوقـي ) یـەکێتیی مافپـەروەرانی عـێراقی لــە لەندەن دەریدەکات .

## تۆڕی ئەنتەرنێت :

١٩ - گۆڤـاری ( وسـائل الاعـلام و الاخـلاق ) ی ئــەلیکترۆنی کــە وەزارەتــی دەرەوەی ئەمــەریکا لەســـەر تــــۆڕی ئەنتـــەرنێت دەریدەکات.

٢٠ - http:// www . usinfo . state . gov / journals / 0401 / ijga / htm

٢١ - http:// www. Law . emory . edu / federal . uskonst . htm

## یاسا و دەستور :

٢٢ دەستوری ئەمەریکیی ساڵی ١٧٩٨ ی هەموارکراو

٢٣ قانون تنظيم الصحافة المصرية رقم ٩٦ لسنة ١٩٩٦

٢٤ قانون المطبوعات اللبناني رقم ٢٠ لسنة ١٩٦٢ المعدل

٢٥ یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستانی عێراق ژمارە ( ٤ ) ی ساڵی ١٩٩٨

## نوسەر لە چەند دێڕێکدا:

- لە ساڵی ١٩٥٦ لە شاری هەولێر لە دایک بووە.
- لە ساڵی ١٩٨٨/١٩٨٩ کۆلێژی یاسای لە زانکۆی سەلاحەددین تەواوکردووەو بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە یاسا وەرگرتووە.
- لە ١٩٩٦/٥/٣١ بڕوانامەی ماستەری لە یاسا لە نامەی (( حق الملكية الأدبية والفنية في القانون العراقي والمقارن )) لە کۆلێژی یاساو ڕامیاری لە زانکۆی سەلاحەددین وەرگرتووە.
- لە ٢٠٠٣/٧/٧ بڕوانامەی دکتۆرای لە یاسا لە نامەی (( چوارچێوەی یاسایی ئازادی ڕۆژنامەگەری لە کوردستانی عێراقدا )) لە کۆلێژی یاساو ڕامیاری لە زانکۆی سەلاحەددین وەرگرتووە.
- بێ لە وتارو تۆژینەوە زانستییەکان، ئەم چاپکراوانەی خوارەوەی هەیە
- شەش کورتەچیرۆکی کوردی هاوبەش.
- ون بوون چیرۆک.
- دەرکا چیرۆک.
- سەعید زەبۆکی لای خۆمان ڕۆمان.
- چەمکی ماف چاپی یەکەم + چاپی دووەم.
- لێکدانەوەی یاسای بەکرێدان.
- چەمکی یاسا.
- حقوق المؤلف.
- یاساو ماف.
- مافی دانەر وەرگێڕان، هاوبەش.
- تڕحێو چیرۆک.
- دەسەڵاتی چوارەم.
- هونەری منداڵان.
- ئەم بەرهەمانەی ئامادەیە بۆ چاپ:
- ئاو ڕۆمان.
- حزبی پڵاو ڕۆمان.
- چەند وتارێکی ڕۆژنامەوانی.

## لەبەرهەمە چاپكراوەكانی پرۆژەی ماف:

١- پەیرەوپرۆگرامی رێكخراوی بلاوكردنەوەی رۆشنبیریی یاسایی ٢٠٠١.

٢- الفدرالیة الكوردستانیة و التوقعات المستقبلیة ٢٠٠١.

٣- لەبارەی رۆشنبیریی سیاسی - د. شیرزاد احمد النجار - و. محمد وەسمان ٢٠٠٢.

٤ دەماگیریی نەتەوایەتی - د. محەمەد گەزنەیی ٢٠٠٢.

٥- مساهمة في الامن القومي و سیاسة الدفاع و جدلیة العلاقة بینهما الحقوقي / ماجد طاهر خلیل ٢٠٠٢.

٦- یاسای رۆژنامەگەری - د. كەمال سەعدی ٢٠٠٣.

٧- شرح قانون الجنسیة العراقیة المحامي سركوت سلیمان.

٨- شرح اصول المحاكمات الجزائیة د. رزگار محمد قادر، ٢٠٠٤.

٩- ئازادیی رۆژنامەگەریو ئەخلاقی پیشە د. كەمال سەعدی، ٢٠٠٤.